# طاغوتەکان
# و
# شێخ و زانایانی خراپ

پێشکەشکردنی

ڕادیۆی بەیان

وەرگێڕانی

دابان تەوحیدی

جمادى الآخر ١٤٤٢هـ

# طاغوتەکان و شێخ و زانابانی خراپ

پێشکەش کردنی :

ڕادیۆی بەیان

وەرگێڕانی :

دابان تەوحیدی

دیزاین :

هومام کوردی

# پێشەکی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم ، الحمد لله ، والصلاة والسلام على رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ، وأشهد أن لا إله إلا الله ، وأشهد أن محمدًا عبده ورسوله ( صلى الله عليه وسلم )

أما بعد...

قال الإمام ابن سيرين ( رحمه الله تعالى ) :

« إنّ هَذَا العِلم دِين فانظُروا عمّن تأخذون دِينَكُم » ( رواه مسلم )

واتە : ئیمامی إبن سیرین ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) دەفەرموێت : ئەم زانستە دینە ، جا سەیربکەن بزانن دینەکەتان لە کێ وەردەگرن.

جا ئاگاداربە ئاگاداربە! کەوا بزانە عیلمی شەرعی لای کوێ دەخوێنی ، وە گوێ لە چ کەسێک دەگریت! چونکە تۆ شوێنی ئەوە دەکەویت کە زاناکەت لەسەری دەڕوات و پەیڕەوی ئەکات ، جا ئەگەر ئەو لەسەر هیدایەت بێت تۆش لەسەر هیدایەتی ، وە ئەگەر لەسەر گومڕایی بێت تۆش لەسەر گومڕایی !!!!!

ئیمامی إبن کثیر لە تەفسیرەکەیدا لە ( بەرگی ٦ : لاپەڕە ٤٤٤ ) لە بارەی ئەو ئایەتەی کە الله تعالى دەفەرموێت:

{ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ }

واتە : وە دەڵێ : ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە بە گوێی سەران و گەورەکانمان کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین.

||سورەتی الأحزاب : ئایەتی ٦٧ . تەفسیری پوختە||

جا ئیمامی إبن کثیر دەفەرموێت : پێشەوا طاوس فەرموویەتی:

**( سَادَتَنَا )** واتە : سەرکردە و فەرمانڕەواکان

**( وَكُبَرَآءَنَا )** واتە : زاناکان

( رواه إبن أبي حاتم ) .

واتە : ئێمە شوێن سەرکردەکانمان کەوتبووین وە ئەوانیش فەرمان ڕەواکانن ، وە گەورەکانیش بریتین لە شێخ و زانا و مامۆستاکان ، بۆیە ئێمە پێچەوانەی پێغەمبەرمان کرد ( صلى الله عليه وسلم )، وە ئێمە بیرو باوەڕمان وابوو کە ئەوان شتێکیان لەلایە ، وە ئەوان لەسەر شتێکن ، بەڵام ئەوان لەسەر هیچ شتێک نەبوون ...

* بۆیە چاک بزانە الله ڕەحمت پێ بکات هەرگیز وەکو مورجیئەکانی سەردەم ئەم قسەیە دووبارە نەکەیەوە ، کە خۆمان گوێمان لێیان بووە کە دەڵێن ، ئەگەر الله تعالى لە قیامەت لێپرسینەوەی لەسەر ئەو بیروباوەڕە لەگەڵ کردین ئەوا دەڵێین یارب ئێمە شوێنەکەوتەی فلانە

زانا بووین! بۆیە چاک بزانە کەوا بۆت نابێتە عوزرلە قیامەت ، ئەگەر شێخەکەت لەسەر گومڕایی بێت تۆش لەسەر گومڕایی!!!

* لە حوذەیفەی کوڕی یەمانەوە ( الله لێی ڕازی بێت ) دەڵێ : پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی :

( بانگخوازانێک پەیدا دەبن لەسەر دەرگاکانی دۆزەخ ، هەرکەسێک بەقسەیان بکات فڕێی دەدەنە ناویەوە ( یەعنی ناو دۆزەخ! )، حوذەیفە فەرمووی : وەصفیان بکە بۆمان ؟ رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ئەوان هەر لەخۆمانن و بەزمانی خۆمان قسە دەکەن! حوذەیفە فەرمووی فەرمانی چیم پێدەکەی گەر پێیان گەیشتم ( واتا : بەو بانگخوازانە ) پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : دەست بگرە بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە ، ئەگەر کۆمەڵ و پێشەوایان نەبوو ، لەهەموو ئەو دەستە و کۆمەڵانە دابڕێ ! ئەگەرچی قەپت کردبێت بەبنی دارێکدا تاکو کاتی مردنت دێت و تۆش هەر لەسەر ئەو حاڵە بیت ) !!!

[ صحيح البخاري ( ٣٦٠٦ : ٧٠٨٤ ) ـ صحيح مسلم ( ١٨٤٧ )]

بۆیە گومڕا بوونی زۆرێک لەم خەڵکە بەهۆی زۆرێک لەم بەناو بانگخوازانەوەیە چونکە کوفریان بۆ حەڵاڵ دەکەن و پشتیوانی کافران دەکەن و دوعای سەرکەوتنیان بۆ دەکەن خەڵکە نەزانەکەش

وا دەزانن کە ئەم عەلمانی و کافرانە کافر نینە چونکە ئەوەتا بەناو مامۆستاکان وا لەسەر مینبەر دوعای سەرکەوتنیان بۆ دەکەن وە هەروەها عەقیدەیەکی ڕاست و صەحیح بەم خەڵکە ناڵێن و حەق ناڵێن ، وە لەپێناوی چەند خۆشیەکی کەمی دونیا قیامەتی خۆیان و خەڵکیش دەدۆڕێنن و دەبنە کەسێکی گومڕا و گومڕاکەر ، الله تعالى پەنامان بدات ، جا ڕادیۆی بەیان وەک بە ئاگاهێنانەوەیەک بۆ ئەم جۆرە بەناو زانایانە و وریاکردنەوەی موسلمانان لێیان بەرنامەیەکیان پێشکەش کرد لە ڕادیۆی بەیانی دەوڵەتی ئیسلامی ( الله تعالى پاداشتی بەخێریان بداتەوە ) بەناوی ( الطواغيت ومشايخ السوء ) کە بەرنامەکە لە هەشت زنجیرە پێکهاتووە و لەلایەن یەکێ لە زاناکانی دەوڵەتی ئیسلامی پێشکەش دەکرێت ، ئێمەش لەم کتێبەدا هەر هەشت زنجیرەکەمان وەرگێڕاوە و بە جودا و بەش بەش دامانناوەتەوە و تێکەڵ بە یەکترمان نەکردووە ، بۆ ئەوەی لەسەر خوێنەریش تێکەڵ نەبێت ، چونکە هەر بەشەو مەوزوعەکەی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی تر ...

داوا لە الله سبحانه وتعالى دەکەین کەوا عاقیبەت خێرمان بکات و بمانپارێزێت لەوەی کە خۆمان و خەڵکیش گومڕا بکەین ، **آمين**.

# بسم الله الرحمن الرحيم

## ( پێشەکی بەرنامە )

إبن رسلان ی شافعی دەفەرموێت:

هەرزانایەک کاربە عیلمەکەی نەکات
سزا دەدرێت لە پێش بت پەرستەکان.

دەزانن و کاری پێناکەن ، هەر دەڵێن و ئەنجامیشی نادەن ، بۆ دونیا کار دەکەن و وازیان لە قیامەت هێناوە ،
بۆ ماڵی دونیا و دەستکەوت و قازانجەکان پێشبڕکێ دەکەن ، بەڵام واز ناهێنن لەو شتانەی کە الله " عزوجل " ڕێگری کردووە لێیان.
فەتوا دەدەن بۆ ڕازی کردنی طاغوتەکان ، بەهۆی عیلمەکەیانەوە بەئارەزووی خۆیان ماڵی دونیا دەخۆن ، نموونەیان وەک نموونەی داری " الدفلی " وایە ( الدفلی : چرۆی دارێکە وەک گوڵی سوور وایە ) کاتێک سەیری دەکەیت سەرسامت دەکات بەڵام گەر بیخۆی دەتکوژێت ، جا نە بە ئازادی و بەڕێز و پایەداریەوە دەژین ، وە نە بەندەیەکیشن لە ڕێزی تەقوادارەکان.

فەهم و تێگەیشتنیان بە قفل ی ئاسن قفل دراوە ، دڵیشیان بۆگەن بووە لەنێو قوڕ و لیتە و کێم و زوخاودا.

گومرا و گومڕاکەرن دوژمنایەتی کارن لەگەڵ دۆستانی " الرحمن " کەچی دۆستن لەگەڵ دۆستانی شەیتان.

خۆیان وا نیشان دەدەن کە ڕێ نیشاندەرن بەڵام لە حەقیقەتدا ڕێگرن .

# ( بەشی یەكەم )

**الحمد لله مالك الملك يؤتي الملك من يشاء وينزع الملك ممن يشاء ويعز من يشاء ويذل من يشاء بيده الخير إنه على كل شيء قدير، والصلاة والسلام على النبي المبين الذي تركنا على المحجة البيضاء ليلها كنهارها لا يزيغ عنها بعده إلا هالك ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله ، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين ، أما بعد :-**

بەڕاستی اللّٰه " عزوجل " مەدح و ستایشی ئەهلی عیلم و زانا بە اللّٰه و بە دینەكەی كردووە ، هەروەكو چۆن اللّٰه سبحانه وتعالى فەرموویەتی :

{ أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الآخِرَةَ وَيَرْجُوا رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الأَلْبَابِ }

واتە : هاوبەش دانەران چاكترن یا كەسێ ملكەچ و پەرستكارە ( بۆ اللّٰه ) لە كاتەكانی شەودا بە سوژدە بردن و ڕاوەستان ( لە شەو نوێژدا ) كە لە ( سزای ) دوا ڕۆژ دەترسێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی ( ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم )) بڵێ : ئایا ئەوانەی دەزانن

یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن ، بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن.

[ سورەتی الزمر: ٩ . تەفسیری پوختە ]

وە الله سبحانە وتعالی فەرمانی کردووە بەوکەسەی کە نازانێت پرسیار لە ئەهلی عیلم بکات و گوێڕایەڵیشیان بکات لەو شتانەی کە فەرمانی پێ دەکەن و ڕێگری لێ دەکەن ، الله تعالی فەرموویەتی :

{ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ }

واتە : پرسیار بکەن لەزانایان ئەگەر ئێوە نازانن.

[ سورەتی النحل : ٤٣ ]

وە هەروەها الله تعالی فەرموویەتی:

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا }

واتە : ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی الله و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن وە پاشانیش گوێڕایەڵی کار بەدەستە ( عادیلە ) کانی خۆتان بن ، جا ئەگەر دوو بەرەکیتان هەبوو لەشتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای الله و پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەگەر ئێوە

باوەڕتان هەیە بە الله و بە ڕۆژی دوایی ، ئەوە باشترە وە ئاكام و ئەنجامی چاكترە .

[ سورەتی النساء : ٥٩]

جا فەرمانی كردووە بە گوێڕایەڵی كردنی زانایان و كار بەدەستان بە مەرجێك دەبێت گوێڕایەڵی كردنیان موافق و شوێنكەوتن بێت بۆ گوێڕایەڵی كردنی الله و گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە ئەگەر خیلاف و ڕا جیاوازیش ڕوویدا لەنێوان خەڵكی یان خیلاف ڕوویدا لەنێوان خەڵك و زانایان یان خیلاف ڕوویدا لەنێوان ڕەعیە و ژێردەستە و فەرمان ڕەواكان یان لەنێوان زانایان و فەرمانڕەواكان ئەوا پێویستە ئەم نیزاع و ناكۆكیە بگەڕێندرێتەوە بۆلای الله و بۆلای پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) " واتە : بۆلای كتابی الله و بۆلای سوننەتی پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) " جا هەر ئەمە چاكترە بۆ خەڵكی لە دونیا و قیامەت.

وە ئەو زانایانەش سوود لە علیم و زانستەكەیان دەبینن ئەوانەی كە عیلم و زانستەكەیان دەیانكات بەو كەسەی كە ترسی هەیە لە الله تعالى ، هەروەكو چۆن الله سبحانه وتعالى فەرموویەتی:

{ إِنَّما يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبادِهِ الْعُلَماءُ }

واتە : بەڕاستی لەناو بەندەکانی الله تەنیا زانایان ( وەك پێویست ) لە الله دەترسن.
[ سورەتی فاطر: ٢٨ ]
وە ترسیش بریتییە لە خەوف و ترسێکی جێگیر بەهۆی بە گەورە دانانی الله " عز وجل. "
جا تێیاندا کۆبووەتەوە هەبوونی عیلم و زانست بە الله و عیلم بە فەرمانەکانی لەگەڵ ترسان لێی وە هەروەها بە گەورە دانانی الله سبحانە وتعالی.
وە لەبەر ئەمە شایەنن بۆ ئەوەی کە خەڵکی پابەندیان بن بۆ گوێڕایەڵی کردنی الله و دوورخستنەوەیان لە سەرپێچی کردنی الله و ناسینی الله ، وە بانگهێشت کردنیان بۆ ئیخلاص و نیەت پاکیەتی لە کارو کردەوە ئەنجامدان بۆ الله تعالی ، جا لای الله سبحانە وتعالی پاداشتی باش وچاک هەیە وە هەروەها کەسیش وەک ئەو الله یە ( بێ باوەڕان ) نابەستێتەوە و بەندیان ناکات وە کەس سزای کەس نادات وەکو سزای الله.
الله تعالی باسی زانایانی ئەهلی کتابی کردووە لە پێش ئێمەدا ، وە باسی کردووە کە کامەیان شایەنی زەم و سەرزەنشت کردن بووە لێیان ، وە مەدحی ئەوانەشی کردووە کە دەستیان گرتبوو بە کتێبەکەیان

لەپێش ناردنی پێغەمبەرمان محمد ( صلی الله علیه وسلم ) وە كاریان دەكرد بۆ چاك كردنی خەڵكی بە فێركردنی دینەكەیان و فەرمان كردنیان بە چاكە و ڕێگری كردنیشیان لە خراپە ، الله تعالی دەربارەی نەوەی ئیسرائیل فەرموویەتی:

{ وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا } واتە : ( وە ئەوانمان لەسەر زەویدا بە چەند كۆمەڵێك دابەش كرد ) ، واتە : لە زەویدا پەرتمان كردن و كردنمان بە چەند دەستەو بەستەی لێكترازاو لەدوای ئەوەی كە كۆمەڵێک بوون ،

{ مِّنْهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ } واتە : ( هەندێكیان چاكە كارن ) ، هەڵدەستان بە ئەنجامدانی حەق و مافەكانی الله و حەق و مافی بەندەكانی ،

{ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ } واتە : ( وە هەندێكیشیان وەك ئەوان نەبوون ) ، واتە : صالح و چاك نەبوون ، جا یان ئەوەتا مام ناوەندی بوون كە واجیباتەكانیان ئەنجام دەدا بەبێ ئەنجامدانی سوننەتەكان ، وە واز دەهێنن لە حەڕام كراوەكان بێ ئەوەی كە وازبهێنن لە مەكروهەكان ، وە یانیش ئەوەتا ستەمیان لەخۆیان دەكرد ،

{ وَبَلَوْنَاهُم } واتە : ( وە تاقیمان كردنەوە ) لەسەر عادەت و سوننەتمان ،

{ بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ } واتە : ( بە چەندەها چاکە و خۆشی و بە چەندەها خراپە و ناخۆشی ) ، واتە : ناخۆشی و قورسی وە خۆشی و ئاسانی ،

{ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ } واتە : ( بە ئومێدی ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای الله ) ، بگەڕێنەوە لەو شتانەی کە لەسەری بوونە لە جێگیر بوون و بەردەوام بوون لە گومڕایەتی ، وە بەخۆیاندا بچنەوە و بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە لەسەری درووستکراون لە هیدایەت ، جا ئەمە هەر بەردەوام بوو لەنێوان پیاوچاک و پیاو خراپ و مام ناوەند هەتاوەکو:

{ فخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ } واتە : ( دوای ئەوان جێ نشینانێکی خراپ هاتنە جێگەیان کە میراتگری تەورات بوون ) ، خراپەیان زیاتر بوو کە لەدوایانەوە میراتگری تەوڕات بوون ، وە مەرجەع و سەرچاوە تیایدا بۆلای خۆیان بوو ، وە بە هەواو ئارەزووی خۆیان هەڵسوکەوتیان تێدا دەکرد ، وە ماڵ و سامانی خۆیان دەدا بۆ ئەوەی فەتوا بدەن و حوکم بە ناحەق بکەن ، وە هەروەها ڕیشوە و بەرتیلیش لەناویاندا بڵاو ببوویەوە ،

{ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ } واتە : ( کەلوپەلی ( حەرامی ) ئەم دونیایەیان هەڵبژارد ) ، واتە : دینەکەی خۆیان دەفرۆشت لەبەرامبەر

کاڵا و ماڵی ئەم دونیایە ، وە دانیشیان دەنا بەوەی کە ئەوان تاوانبار و ستەم کارن ، وە لەگەڵ ئەمەشدا:

{ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا } واتە : ( وە دەیان گوت بێگومان ئێمە عافو دەکرێین ) ، وە ئەم بانگەشە کردنەش دووربوو لە حەقیقەتەوە ، وە قسە کردن بوو بەناوی اللە بەبێ عیلم ، بە جورئەت و چاونەترس بوون لەسەر تاوانە گەورەکان و دەشیانگوت ئێمە عافو دەکرێین ، وە ئەگەر داوای لێ خۆشبوونیان کردبوایە اللە لێیان خۆش دەبوو لەبەر پەشیمان بوونەوەیان لەسەر ئەو کارانەی دەیانکرد وە سووریش بوونایە لەسەر ئەوەی کە جارێکی تر بۆی ناگەڕێنەوە ، بەڵام ئەوان ئەگەر کاڵا و ماڵێکی تری دونیا و بەرتیلێکی تریان بۆ هاتبا وەریان دەگرت ، بۆیە ئایەتەکانی اللە یان بە نرخێکی کەم دەفرۆشت وە شتی خراپیان دەگۆڕیەوە لەجێگای شتی باش و چاک. ...

اللە تعالی لە ئینکاری کردنی لێیان و ڕوونکردنەوەی جورئەت و چاو نەترسیاندا فەرموویەتی:

{ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ } واتە : ( ئایا لێیان وەرنەگیراوە و پێویست نەکراوە لەسەریان پەیمان لە تەوراتدا کە بەدەم اللە وە هیچ نەڵێن بێجگە لە ڕاستی ) ، جا گرنگیان نەدەدا بەوەی کە بەناوی اللە وە دەیانگوت لە ناحەقیەتی ، لەبەر

شوێنکەوتنیان بۆ هەواو ئارەزوو و لادانیان لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزوویان دەکرد ، وە حاڵیشیان بەم شێوەیە بوو کە:
{ دَرَسُوا مَا فِيهِ } واتە : ( ئەوەی لە تەوڕاتدا هەبوو خوێندویانەتەوە ) ، جا هیچ ئیشکال و گرفتێکیشیان نەبوو چونکە حەقیان بەچاکی دەناسی و ڕوون بوو لەلایان بەڵام هەر بە ئەنقەست و ئارەزووی خۆیان ئەم کارانەیان ئەنجام دەدا ، وە هەروەها بەرچاو ڕوونیش بوون لەم کارانەیاندا ، ئا ئەمەش گەورەترینی تاوان و توندترین هەڕەشە و سەرزەنشت کردن و خراپترینە بۆ سزا ، وە ئا ئەمەش لە کەم عەقڵی و بۆچوونە گەمژانەییانەیان بوو لە هەڵبژاردنی ژیانی دونیا بەسەر ئاخیرەتدا ، هەر لەبەر ئەمەش الله تعالى فەرموویەتی:
{ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ } واتە : ( وە ڕۆژی دوایی و ( دەست کەوتی ئەو ڕۆژە ) چاکتر و باشترە بۆ ئەوانەی کە خۆ پارێز و لە الله ترسن ) ، واتە : خۆیان دەپارێزن لەو شتانەی کە الله لێیانی حەرام کردووە ، هەر بۆیەش ژیانی ئاخیرەت زۆر چاکتر و باشترە بۆ موتەقی و خۆ پارێزەران لەو خواردنانەی کە دەتپێکێت وە هەروەها لە خواردنی بەرتیل بۆ حوکم کردن بە جگە لەوەی کە الله دایبەزاندووە وە جگە لەمانەش لە جۆرەهای حەرامکراوەکان .

{ أَفَلَا تَعْقِلُونَ } واتە ( هێشتا ژیر نابن ؟ ) ، واتە : ئایا ژیر نابن و عەقڵتان بەکار ناهێنن بۆ ئەوەی تەوازنی نێوان هەموو ئەو شتانەی پێ بکەن کە پێویستە هەڵبژێردرێت و ئەو شتانەشی کە پێویستە بەسەریدا هەڵبژێردرێت وە ئەو شتانەشی کە لە پێشترە هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی و پێشخستنی ئەو شتانە بەسەر هەموو شتێکی تر ! ، بە تایبەت بەکارهێنانی عەقڵ بۆ تێڕوانین لە سەرەنجامەکان ، بەڵام هەرکەسێک بڕوانێت و سەرنج بدات بۆ پەلە کردن لە هەندێک کاری بێ بایەخ و ناتەواوی پچڕێنەر لەبەرامبەر لەدەستدانی خۆشیەکی گەورەی هەمیشەیی جا ئا ئەمە لەکوێیە عەقڵ و تێڕوانینی!

بەڵکو بێگومان عاقڵ و ژیرە ڕاستەقینەکان کەسانێکن کە الله تعالی وەسفیانی کردووە بەم ووتەیەی خۆی کە فەرموویەتی:

{ وَالَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِالْكِتَابِ } واتە : ( وە ئەوانەی بە توندی دەست دەگرن بە تەوراتەوە ( و پەیڕەوی دەکەن )) ، واتە : لە عیلم و عەمەل دا بە چاکی دەستیان پێیەوە گرتووە کە ئەوەی تیایدا هاتووە لە حوکمەکان دەزانن و خۆیان شارەزا دەکەن لێی وە زانینی ئەو خەبەر و هەواڵانەش ڕێزدار ترینی عیلمەکانە ، وە هەروەها کارو کردەوەش دەکەن بە هەموو ئەوەی کە تیایدا هاتووە لە گشت فەرمانەکان ،

ئەو فەرمانانەی کە شادی هێنەر و دڵ خۆشکەرن و ئاسوودەیی ڕوحەکان و خێرو چاکەی دونیا و ئاخیرەتە.

وە هەروەها لە گەورەترینی ئەوەی کە واجبە دەستی پێیەوە بگیرێت لە فەرمانەکان بریتییە لە ئەنجام دانی نوێژلە دیارو نادیاردا ، وە هەر لەبەر ئەمەش الله تعالى تایبەتی کردووە بە ذکر لەبەر ئەو فەزڵ و ڕێز و گەورەییەی کە هەیەتی وە هەروەها هەبوونی نوێژ تەرازووی ئیمانە وە ئەنجام دانی نوێژ هۆکارێک و بانگەوازی کارێکە بۆ ئەنجام دانی گشت عیبادەتەکانی تریش ، وە لەبەر ئەوەی کردەوەکانیان هەمووی چاکە کردن بوو الله تعالى فەرمووی:

{ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ } واتە : ( بێگومان ئێمە ونی ناکەین پاداشتی چاکەکاران ) ، لە قسەکانیان و کارو کردەوەکانیان و نیەتەکانیان لە چاک سازی کردن بۆ خۆیان و بۆ غەیری خۆشیان.

وە هەروەها الله تعالى فەرموویەتی:

{ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًاۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ }

واتە : ( بێنەوە بیریان کاتێک کە الله وەری گرت پەیمان لەوانەی کە نامەیان پێ بەخشرابوو دەبێ ئەو نامەیە ڕوون بکەنەوە بۆ مەردومان وە نەیشارنەوە بەڵام ئەو ( پەیمانە )یان فڕێ دایە پشت خۆیانەوە و

كڕیان بەو نامەیە نرخێكی كەم ، ئای چەند خراپە ئەوەی كڕیان )
[ آل عمران : ١٨٧ . تەفسیری پوختە }
جا ئەمە بریتی بوو لەوەی كە الله تعالى زانایانی ڕاسپاردووە كە حەق نەشارنەوە بەڵكو دەریبخەن و ڕوونی بكەنەوە و تێكەڵی نەكەن لەگەڵ باطل دا ، هەروەكو چۆن الله تعالى لە مخاطبەی زانایانی بەنی ئیسرائیل دا فەرموویەتی:
{ وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ } واتە : ( وە ڕاست و ڕەوا تێكەڵ مەكەن بە ناڕەوا و درۆ ، حەق و ڕاستی مەشارنەوە لەكاتێكدا كە خۆتان ئەمە دەزانن ) [ البقرة : ٤٢ ) ،
وە الله تعالى لۆمەی زانایانی ئەهلی كتابی كردووە و سەرزەنشتیانی كردووە لەبەرئەوەی پێچەوانەی فەرمانی الله یان كرد كە شتێكیان لەم حەقە شاردەوە كە خەڵكی پێویستیان بوو بیزانن وە هەروەها هەندێك حەقیشیان تێكەڵ دەكرد بە باطل جا الله سبحانه وتعالى فەرموویەتی:
{ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ }
واتە : ( ئەی خاوەن نامەكان بۆ پۆشاكی درۆ ئەكەن بەبەر ڕاستی دا ، وە ڕاستەكە دەشارنەوە لە كاتێكدا خۆشتان ئەمە دەزانن ).

. [ آل عمران : ٧١ ]

وە هەروەها پێغەمبەرمان ( صلى الله عليه وسلم ) بۆمانی ڕوون کردوەتەوە کەوا ئەو موخالەفە و پێچەوانەیەی ئەهلی کتاب لە جولەکە و گاور کەوتبوونە ناویەوە ئیلا لە داهاتوویەکی نزیکیش لەم ئوممەتی موحەمەدییە ڕوودەدات ! ،

وە لەبەر ئەمەش ئیمامی سوفیانی کوڕی عویەینە ( ڕەحمەتی الله لێ بێت ) فەرموویەتی:

( هەرعابیدێک سەرگەردان بوو ، ئەوە لەگەڵ گۆشەگیرانی گاورەکان لێک دەچن ، وە هەر زانایەکمان ڕێی لێ تێکچوو ، ئەوە لێکچوون و سیفەتی جوولەکەی تێدایە ) ، وە زۆرێک لەو شتانەی کە الله سبحانە وتعالی هەواڵی پێ داوە ئەوەیە کە ئەهلی سەعادەت و کامەرانی ئەو کەسانەنە کە حەق دەناسن و شوێنی کەووتوون ، وە ئەهلی شەقاوەت و نەگبەتیش ئەوانەنە کە جاهیل و نەفامن بە حەق و گومڕان لێی ، یانیش عیلمیان پێی هەیە بەڵام پێچەوانەی دەکەن و شوێنی ناحەق دەکەون ، لەبەر ئەمەش مرۆڤی موسلمان لە هەموو ڕکعاتێک لە نوێژەکانیدا دوعا دەکات و دەپاڕێتەوە کە الله تعالی هیدایەتی بدات بۆ ئەم ڕێگا ڕاستە ، ڕێگای ئەوانەی کە الله تعالی نازو نیعمەتی ڕشتووە بەسەریان لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان

و پیاوچاکان ، وە هەروەها مرۆڤی موسلمان لە پەروەردگاری دەپارێتەوە کە بیپارێزێت لە ڕێگای ئەوانەی کە خەشم و قینی لێیان گرتووە ، وە ئەوانیش ئەوکەسانەنە کە حەقیان دەناسی بەڵام کاریان پێی نەدەکرد ، وە سەرگەردان و گومڕاکانیش ئەوانەن کە جاهیل و نەفام بوون بە حەق و گومڕا بوون لێی. ...

وە یەکەمین مامەڵەی پێغەمبەرمان ( صلى الله عليه وسلم ) لەگەڵ ئەوانەی کە عیلم و زانستیان پێ بەخشرا بوو لە ئەهلی کتاب لەگەڵ وەرەقەی کوڕی نەوفەل بوو کە ببوە کەسێکی نەصرانی و کتێبی " العبراني " دەنوسیەوە ، وە هەروەها شارەزای تەوڕات و ئینجیل بوو ، بەڵام لەو کەسانە نەبوو کە بەشدار بێت لەگەڵیان لە تەبدیل کردن وە هەروەها دەستی نەگرتبوو بەوکەسانەشی کە دینەکەیان گوڕیبوو و دەستکاری کتێبەکانی خۆیان کردبوو.

جا لە صەحیحی بوخاری دا هاتووە لە دایکی ئیماندارانەوە عائیشە ( الله لێی ڕازی بێت ) فەرموویەتی:

( پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) حەقی بۆهات کە لە ئەشکەوتی " حراء " بوو ، ئینجا لەم کاتەدا بوو فریشتەکە ( جوبرائیل ) هاتە لای و پێی گوت : ( بخوێنە )

پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( من خوێندەواریم نییە )

فەرمووی : جا جوبرائیل ( عليه السلام ) منی گرت و هەڵیگوشیم تا زۆر بێهێز بووم ، جا بەریدام و دیسان گوتی : بخوێنە ،

منیش گوتم : من خوێندەواریم نییە ،

جا دووەم جار منی گرت و هەڵیگوشیم تا زۆر بێهێز بووم ، جا بەریدام و دیسان گوتی : بخوێنە ،

منیش گوتم : من خوێندەوار نیم ،

جا سێیەم جاریش منی گرت و هەڵیگوشیم تا زۆر بێهێز بووم ، پاشان بەریدام و گوتی:

{ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ } [ العلق : ١-٣ ]

جا پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەو ئایەتانەی لەبەرکردن ، وە گەڕاوە ماڵەوە و دڵە ڕاوکێ گرتی و شانەکانی دەلەرزین و چووە لای خەدیجەی کچی خویلد ( الله لێی ڕازی بێت ) فەرمووی : ( داميپۆشن داميپۆشن . )

جا دایانپۆشی هەتاوەکو دڵەڕاوکێ و ترسەکەی نەما ، جا فەرمووی : ئەی خەدیجە ئەوە چیم لێهات ؟! جا هەواڵەکەی بۆ گێڕاوە و فەرمووی

: ( لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي ) بەڕاستی لە خۆم ترسام نەخۆشیەکم توش بێ و بمرم .

جا خەدیجەش ( الله لێی ڕازی بێت ) فەرمووی:

( نا ، مژدەت لێبێ : والله ی هەرگیز الله تۆ سەرشۆڕ ناکات ، چونکە تۆ سیلەی ڕەحم بەجێ دێنی و باری ماندوو بووان هەڵدەگری و یارمەتی نەداران دەدەیت و ڕێز لە میوانان دەگریت و لەسەر ڕاستی جێگیرت.

پاشان لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا بەڕێ کەوتن بۆ لای ( وەرەقی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەد کوڕی عبد العزیز) کوڕی مامی خاتوو خەدیجە بوو کە لە سەردەمی جاهیلیەتدا ئەم بوبوو بە ( نەسرانی ) و کتێبی ئەنووسی بە نووسینی ( عیبرانی ) ، هەروەها کتێبی ئینجیلی ئەنووسییەوە بە عیبرانی ، ویستی الله ی لەسەر بوو کە بنووسێتەوە ، تەواو بەتەمەنیشدا چوو بوو ، هەردوو چاوی لەدەست دابوو ، پاشان خاتوو خەدیجە فەرمووی ئەی کوڕی مامم گوێ لە برازاکەت بگرە و ئەویش گوتی : « ئەی برازاکەم چیت بینیوە ؟» پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هەمووی بۆ گێڕایەوە ، پاشان ( وەرەق ) گوتی : « ئەوە ( الناموس ) بووە واتا ( سرووش ) ئەو سرووشە کە هاتە لای موسی پێغەمبەر ( عليه السلام ) خۆزگە ئەوەندە ژیانم بکردایە کاتێك کە تۆیان دەردەکرد لە ناو کەسوکارەکانت .» پێغەمبەریش ( صلى الله

عليه وسلم ) فەرمووی : « بۆ دەرم دەکەن ؟» گوتی : « بەڵێ ، هیچ پیاوێک نەبووە لە پێغەمبەران وای بەسەر نەیەت ، خۆزگە ڕۆژان بمایەتەوە هەتاکو تۆم سەربخستایە و یارمەتیم بدایتایتە » بەڵام ئەوندەی پێ نەچوو وەفاتی کرد لەو ماوەی کە سرووش دەهاتە خوار .

إبن حەجەر لە [ فتح الباري ]دا فەرموویەتی:

لەبەرئەوەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل و زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نفیل ڕقیان لە بت پەرستی دەبوویەوە چوون بۆ شام و شوێنی تریش کە پرسیاریان دەربارەی دین دەکرد ، بەڵام وەرەقە سەرسامی دینی نەسرانیەت بوو ، وە بوو بە نەسرانی و هەروەها گەیشت بەو گۆشەگیر و عابیدانەی کە لەسەر دینی عیسا ( عليه السلام ) مابوونەوە و نەگۆڕابوون ، وە هەر لەبەر ئەمەش هەواڵی پلەو پایەی بە پێغەمبەر دا ( صلى الله عليه وسلم ) و موژدەی پێدا ، جگە لەمانەش لەو شتانەی کە ئەهلی تەبدیل شێواند بوویان ، وە کاتێک وەرەقە گوێی لە پێغەمبەرمان بوو ( صلى الله عليه وسلم ) لە هەواڵی هاتنی وەحی وەرەقە ئاواتی دەخواست کە ( جذع ) بووایە ، وە " الجذع " یش بریتییە لە ئاژەڵی بچووک ، وەک ئەواتە خوازیەک بۆ ئەوەی

له‌كاتی ده‌ركه‌وتنی بانگه‌وازی ئیسلام گه‌نجێك بووایه‌ بۆ ئه‌وه‌ی توانای سه‌رخستنی هه‌بێت.

پاشان پێغه‌مبه‌ر ( صلى الله عليه وسلم ) ڕووبه‌ڕووی جۆرێكی تر بوویه‌وه‌ له‌وانه‌ی كه‌ عیلمیان پێ به‌خشرابوو كه‌ ئه‌ویش " ئومه‌ییه‌ی كوڕی أبی صلت " بوو ، جا ئومه‌ییه‌ یه‌كێك بوو له‌وانه‌ی كه‌ ئینكاری له‌ شیركی موشریكان ده‌كرد وه‌ خۆشی به‌ری كردبوو له‌ گومڕایه‌تیه‌كه‌یان به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا نه‌بوو به‌ موسلمان ، له‌ صه‌حیحی موسلم دا هاتووه‌ ، له‌ الشريد كوڕی سويد ی الثقفي ( الله لێی ڕازی بێت ) فه‌رموویه‌تی : ( ڕۆژێكیان له‌دوای پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ بووم ( صلى الله عليه وسلم ) و فه‌رمووی : ( ئایا هیچ شیعرێكی ئومه‌ییه‌ كوڕی أبي الصلت ت له‌به‌ره‌ ؟ ) شرید ده‌ڵێت گوتم : به‌ڵێ ، پێغه‌مبه‌ریش ( صلى الله عليه وسلم ) فه‌رمووی : ( بۆم بڵێ ) ، منیش به‌یت یێك له‌ شیعره‌كانی ئه‌وم بۆ وت ، پێغه‌مبه‌ر ( صلى الله عليه وسلم ) فه‌رمووی : ( دانه‌یه‌كی تریشم بۆ بڵێ ) ، پاشان منیش به‌یت یێكی تر له‌ شیعره‌كانی ئه‌وم بۆ وت ، هه‌ر فه‌رمووی ( هێشتا زیاترم بۆ بڵێ ) هه‌تاوه‌كو گه‌یشته‌ سه‌د به‌یت و كۆپڵه‌ شیعری ئومه‌ییه‌ كه‌ بۆم وت ، ئینجا پێغه‌مبه‌ر ( صلى الله عليه وسلم ) فه‌رمووی : ( خه‌ریك

بوو ئومەییەی کوڕی ئەبی صەلت موسڵمان بێت )) وە لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە : ( بەڕاستی خەریک بوو موسلمان بێت لە شیعرەکەیدا ) جا ئومەییەی کوڕی أبي الصلت نموونەیەکی خراپی ئەو زانایانەیە کە حەق و هیدایەتی ناسی بەڵام شوێنی نەکەوت بەڵکو موحارەبە و دوژمنایەتی حەقی کرد و کافر بوو بە الله و بە کافریش مرد ، حەسودیەکەی هەڵیدایە ناو ئاگرەوە پەنا بە الله تعالى ، إبن کەثیر ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە ( الله لە هەردووکیان ڕازی بێت ) دەربارەی ئەم ووتەیەی الله تعالى فەرموویەتی کە الله تعالى دەفەرموێت:

{ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا }

واتە : وە ( ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم )) بخوێنەرەوە بەسەریاندا هەواڵی ئەو کەسەی کە نیشانەکانی خۆمان پێ بەخشی ) [ الأعراف : ١٧٥ ]

عبدالله فەرمووی : ( ئەو کەسە هاوڕێکەتان ئومەییەی کوڕی أبی صەلت ە ) ،

وە هەروەها بە شێوازی تریش لێیەوە ڕیوایەت کراوە و صەحیحیشە ، هەروەک ئەوەی کە ئومەییەی کوڕی أبی صەڵت بیەوێت خۆی بەو بچوێنێت

چونكە ئومەییە عیلم و زانستێكی زۆری پێ گەیشتبوو لە عیلمی شەریعەتەكانی پێشووتر، بەڵام سوودی لە عیلمەكەی نەبینی چونكە گەیشتە سەردەمی رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) وە هەروەها گشت نیشانە و ئایات و موعجیزەكانی پێگەیشتبوو ، وە هەروەها بۆ هەموو كەسێك دەركەوتبوو كە بەسیرەت و بەرچاو ڕوونی هەیە ، لەگەڵ هەموو ئەمانەشی كە تێیدا هەبوو و لێی كۆببوویەوە بەڵام شوێنی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نەكەوت ، وە چوو بەرەو موالات و دۆستایەتی كردنی موشریكان و سەرخستنیان و مەدح و پیا هەڵدانیان ، وە لاواندنەوە و شیعری دەوت بۆ ئەهلی بەدر لە موشریكان بە لاواندنەوە و شیعری زۆر بەلیغ و ڕەوان " قبحه الله تعالی " ، وە هەروەها لە هەندێك فەرموودەدا هاتووە كەوا ئومەییە یەكێك بوو لەو كەسانەی كە بە زمانی ئیمانی هێنا بەڵام لە دڵیەوە ئیمانی نەبوو ، چونكە هەندێك شیعری ( رباني ) و دانایی و ڕەوان بێژی هەبوو بەڵام الله تعالی دڵی فران نەكرد بۆ ئیسلامەتی .

# ( بەشی دووەم )

هەرکەسێک سیرە و ژیانی پێغەمبەرایەتی ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ هاوڕێکەی بخوێنێتەوە ، بە دڵنیاییەوە سەرسامی دەیگرێت لە مەوقیفەکانی جولەکە و زاناکانیان لە بەرامبەر پێغەمبەرمان محمد ( صلی الله علیه وسلم ) و بانگەوازی کردنی بۆ ئیسلام ، جا بێ گومان شتێکی شاراوەش نەبووە لەلایەن لە دەرکەوتنی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لە مەککەدا ، جا نە چوون بەرەو ڕووی ، وە نە دەستپێشخەریان کرد بۆ سەرخستنی ، لەکاتێکدا ئەوانە هاتبوون بۆ مەدینە و نیشتەجێ ببوون بۆ چاوەڕوانی کردنی هاتنی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەتاوەکو الله تعالی " ئەنصار " ی لەناویاندا هەڵبژارد ، بۆ سەرخستنی دینەکەی و لەخۆ گرتن و جێ کردنەوەی پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) و شوێنکەوتنی ، بەڕاستی خۆشیان بێ ئاگا و نەزان و جاهیل کردبوو لە ئاست ناردنی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەتاوەکو کاتێک پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هاتە لایان لە مەدینەدا ، وە دەوڵەتێکی ئیسلامی تێدا دامەزراند ، ئینجا دەستیان کرد بە حەسودی بردن بە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ، و دوژمنایەتیان بۆی دەرخست ، وە ڕق و

قینەی خۆیان بە فووی دەمیان دەرخست ( بە قسە پێ ووتنی بە زمانیان ) ، وە فێڵ و پیلانیان بۆی دەگێڕا ، وە بانگەشەی درۆ و بوهتانیان دەکرد بەوەی کەوا ئەمە ئەو پێغەمبەرە نییە کە چاوەڕوانی بووینە تاوەکو ئیمان و باوەڕی پێ بهێنن .

محمدی کوڕی إسحاق لە [ السيرة ]دا ڕیوایەتی کردووە:

لە عاصم ی کوڕی عومەر ، لە قەتادەی ئەنصاریەوە ( ڕەحمەتی الله لێیان بێت ) لە شێخەکانی خۆیانەوە ( واتە لە ئەنصاریەکان ) هاتووە :

گوتیان : واللە ئەو پێغەمبەرە لە ئێمەیە ، وە لەوانیشە ، واتە : لە ئەنصار و لە یەهود ، ئەوانەی کە دراوسێ و نزیکیان بوون ، ئینجا ئەم باسە دابەزی ، واتە ئەم ئایەتە:

{ وَلَمَّا جَاءَهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَمَّا جَاءَهُم مَّا عَرَفُوا كَفَرُوا بِهِ ۚ فَلَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْكَافِرِينَ }

واتە : ( کاتێک کە نامەیەکیان بۆهات ( کە قورئانە ) لەلایەن الله وە کە پشتیوانی تەوڕاتەکەی ئەوانە ( پەسەندکەری ئەو تەوڕاتەی کەلایانە ) وە ئەوان ( جوولەکەکان ) لەوەو پێش داوای زاڵ بوونیان ئەکرد لە الله بەسەر ئەوانەی کە بێ بڕوابوون ، کەچی کاتێک ئەو )

پێغەمبەر )ەی دەیانناسیی بۆیان هات ، بێ بڕوابوون پێی ، کەواتە نەفرینی الله لەبێ بڕوایان بێ ).

جا گوتیان : ماوەیەک لە جاهیلەتدا بەرزمان کردنەوە ، وە ئێمە ئەهلی شیرک بووین و موشریک بووین ، وە ئەوانیش ئەهلی کتاب بوون ، جا دەیانگوت : بەم زووانە پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکان دەنێردرێت ، کە ڕۆژگاری هاتنی نزیک بۆتەوە ، شوێنی دەکەوین و لەگەڵ ئەودا لەدژی ئێوە دەجەنگین وەک شەڕی عاد و ئیرەم کە چۆن لە بەین چوون ، بەڵام کاتێک الله تعالى پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) نارد لە قورەیش ، ئێمە شوێنی کەوتین ، وە ئەوانیش ( جولەکەکان ) بێ باوەڕ بوون پێی ، الله تعالى فەرمووی:

( فَلَمَّا جَاءَهُم مَّا عَرَفُوا كَفَرُوا بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْكَافِرِينَ )

واتە : ( کەچی کاتێک ئەو ( پێغەمبەر )ەی دەیانناسیی بۆیان هات ، بێ بڕوابوون پێی ، کەواتە نەفرینی الله لەبێ بڕوایان بێ..... )

.........

وە لە فەزڵ و ڕەحمەتی الله تعالى بوو کە هەندێک لەوانی هیدایەت دا بۆ ئیسلام ، لە ئەهلی کتاب ، جا عیلم و زانستیان بەو موژدەیە هەبوو کە پێیان درابوو بە هاتنی پێغەمبەرمان محمد ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە دەیانزانی کەی دەردەچێت ، وە هەموو سیفەتەکانی

پێغەمبەریشیان ( صلى الله عليه وسلم ) دەناسیەوە ، هیچ شتێک نەمابوویەوە تەنها هاتنی نەبێت ، جا چوون بۆ بینینی و گوێیان لێ گرت و پاشانیش ئیمانیان پێ هێنا و سەریان خست ، وە شایەتی حەقیان دا لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ، هەروەکو چۆن الله تعالى فەرموویەتی:

{ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَكَفَرْتُمْ بِهِ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ }

واتە : ( ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم ) بڵێ : پێم بڵێن ئەگەر ( ئەم قورئانە ) لەلایەن الله وە بێ ئێوەش باوەڕتان پێ نەهێنابێ ، وە کەسێك لە نەوەی ئیسرائیل شایەتی دابێ لەسەر وێنەی ( ئەوەی وا لە ) قورئاندا جا ئیمانی هێنابێ ، کەچی ئێوە خۆتان بە گەورەزانی ، بێگومان الله ڕێنموونیی گەلی ستەمکاران ناکات ) .

بەڵام تێکەڵ کردنی حەق بە باطل لەلایەن ئەهلی کتاب ەوە ئەوا بەهۆی زۆر ڕێگاوە بوو ، لەوانیش :

ئەهلی کتاب ئەو تەوڕات و ئینجیل ەیان تێکەڵ دەکرد کە الله تعالى دایبەزاندبوو بە شتانێک کە خۆیان هەڵیانبەستبوو و درووستیان کردبوو ، وە بە دەستی خۆشیان دەیاننوسیەوە ، لە هەڵبەستنی درۆ

بەناوی الله و بەناوی پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە لەوانیش:

ئەوە بوو كەوا ئەوان دانیان دەنا بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان محمد ( صلى الله عليه وسلم ) بەڵام بانگەشەی درۆیان دەكرد بەوەی كەوا محمد ( صلى الله عليه وسلم ) بۆلای ئەوان نەنێردراوە بەڵكو بۆلای غەیری ئەوان نێردراوە ، وە لە شێواندن و تێكەڵ كردنەكانیان ، ئەوە بوو كە لەوان كەسانێك هەبوو ڕێگای نیفاقی ئەكبەریان گرتبووە بەر ، لە زاهیر و ڕووكەشدا باوەڕیان دەهێنا لەگەڵ شاردنەوەی كوفر و عەداوەت و دوژمنایەتی لە ناخیاندا بۆ دانانی پیلان بۆ ئیسلام و موسلمانان.

ئیمامی موجاهید دەربارەی ئەم ووتەیەی الله تعالى فەرموویەتی كە الله تعالى دەفەرموێت:

{ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ }

واتە : ( ئەی خاوەن نامەكان بۆ پۆشاكی درۆ ئەكەن بەبەر ڕاستیدا ، وە ڕاستەكە دەشارنەوە ، لەكاتێكدا خۆشتان ئەمە دەزانن.)

ئیمامی موجاهید دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت:

"پێغەمبەرایەتی محمد دەشارنەوە ، لەکاتێکدا ئێوە لەلای خۆتانەوە پێتان گەیشتووە و بینیوتانە لە تەوڕات و ئینجیل دا ،
کەواتە تەئویلی ئایەتەکە:
ئەی زانایانی ئەهلی کتاب لە خەڵکی تێکەڵ مەکەن و لێیان مەشێوێنن دەربارەی پێغەمبەرایەتی محمد ( صلى الله عليه وسلم ) و ئەوەشی بۆی هاتووە لەلایەن پەروەردگاریەوە ، لەکاتێکدا بانگەشەی ئەوەش دەکەن کەوا ئەو بۆ هەندێک لەجۆری ئومەتەکان نێردراوە نەوەک بۆ هەمووی ، یانیش دوو ڕوویی دەکەن لە کارەکەیدا ، لەکاتێکدا چاک دەزانن کەوا بۆلای گشتتان و تەواوی ئوممەتەکانی بێجگە لەئێوەش نێردراوە ، جا بەهۆی ئەمەوە دەتانەوێت ڕاستی تێکەڵ بە درۆ بکەن و ڕاستیەکە بشارنەوە کەچی لەنێو کتێبەکانی خۆشتاندا پێتان گەیشتووە و بینیوتانە لە ڕەوشتی جوانی و سیفەتی ئەودا ، وە بێگومان ئەو نێردراوی منە بۆلای خەڵکی بە گشتی ، لەکاتێکدا چاک دەزانن کەوا ئەوە نێردراوی منە وە ئەوەشی ( ئەو قورئانەشی ) کە پێی هاتووە بۆلای ئێوە ئەوە لەلای منەوەیە ، وە ئاگادارن و دەزانن دەربارەی ئەو پەیمانەی کە لە ئێوەم وەرگرت لە کتێبەکەتاندا بریتی بوو لە ئیمان هێنان پێی و بەوەشی کە پێی دێت ( کە قورئانە ) وە بە ڕاست دانانی ".

وه لە شێوازێکی تری تەلبیس و تێکەڵیەکانی زانایانی یەهود لە تێکەڵ کردنی حەق بە باطل:

ئەوە بوو کە ئەوان یەک دەنگ بوون لەسەر پیلان گێڕان بۆ ئیسلام بەوەی کە ئیسلامیەتی خۆیان و موسلمان بوونیان دەردەخست لە سەرەتای ڕۆژدا پاشانیش لە کۆتایی ڕۆژەکەدا کافر و بێ بڕوا دەبوونەوە بە ئیسلام بۆ ئەوەی نەزان و بێ ئاگاکان لە ئیسلام گومڕا بکەن ، وە هەوڵیان دەدا کە ئەوانەی ئیمانیان بە ئیسلام هێنابوو مورتەد بکەنەوە و هەڵیان بگەڕێننەوە لە دینەکەی ، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکانە وا تێبگەیەنن کەوا ئەوان لە ئیسلام پاشگەز بوونەتەوە لەبەرئەوەیە کەوا ئەوان بۆیان دەرکەوتووە ئەم دینە عەیب و کەمو کوڕی تێدایە ، وە هەروەها ئەمە ئەو دینە نییە کە الله پێی ڕازیە ، ئینجا الله تعالى فێڵ و پیلانەکانیانی دەرخست و فەزحی کردن ، هەروەکو چۆن الله تعالى فەرموویەتی:

{ وَقَالَت طَّائِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُوا بِالَّذِي أُنزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُوا آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ }

واتە : ( وە دەستەیەک لە خاوەن نامەکان وتیان ( بە هەندێکیان ) : بڕوابێنن بەو قورئانە کە نێراوەتە خوارەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان

هێناوە سەرلە بەیانیان ( بە فێڵ ) ، وە بێ بڕوا ببنەوە دەمەو ئێوارە ، بەڵکو ئەوانیش پەشیمان ببنەوە. )

بەم پیلان دانانەوە دەیانویست ئەمر و کارو باری ئەم دینە لەسەر لاوازەکان لە خەڵکی تێکەڵ بکەن و بشێوێنن.

وە ئەویش بریتی بوو لەوەی کەوا لەنێوان خۆیاندا ڕاوێژیان بە یەکتری دەکرد کە لە سەرەتای ڕۆژدا ئیمان و باوەڕیان دەربخەن و لەگەڵ موسلماناندا نوێژی بەیانی بکەن ، جا کاتێک کۆتایی ڕۆژ دەهات هەڵدەگەڕانەوە و مورتەد دەبوونەوە بۆ نێو دینەکەی خۆیان بۆ ئەوەی خەڵکە جاهیل و نەفامەکە بڵێن:

"هەڵگەڕانەوەیان بۆ سەر دینەکەی خۆیان لەبەرئەوەیە کە کەمو کوڕیان بۆ دەرکەوت ، بۆیە عەیب و ناتەواوی لە دینی موسلمانان هەیە"

وە هەرلەبەر ئەمەش دەیانگوت : ( لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ).

**وە لێرەدا حەقە بۆ هەموو موسلمانێک کە پرسیار بکات :**

بۆچی زانایانی ئەهلی کتاب ئیمانیان نەهێنا بە پێغەمبەرمان محمد ( صلى الله عليه وسلم ) ؟

بۆچی نەبوون بە یەکەمین ئیماندار پێی لەجیاتی ئەوەی کە ببن بە یەکەم کافر و بێ باوەڕ پێی ؟

بۆچی موحارەبە و جەنگ و بەربەرەکانێی ئەویان کرد و خەڵکیان لێی دوور دەخستەوە لەجیاتی ئەوەی کە سەری بخەن و موحارەبە و جەنگ و بەربەرەکانی دوژمنەکانی بکەن ؟

ئایا نەدەترسان لە سزای الله تعالی ؟!

ئایا هیوا و ئومێدیان بە رەحمەت ولێ خۆشبوون و بەهەشتی الله تعالی نەبوو ؟

وە ئەو شتە چی بوو کە پەشیمان و پاشگەزی کردنەوە لەوەی کە نەفسی خۆیان بفرۆشن لەپێناوی ڕەزامەندی الله تعالی ؟

وەڵامی یەکلایی کەرەوە لە دەربارەی هەموو ئەم پرسیارانەی کە کران لە کتابی الله " عزوجل " هاتووە و الله تعالی بە چاکترینی ڕوونکردنەوە ڕوونی کردوەتەوە ، جا الله تعالی فەزحیانی کرد و هەموو ئەو نهێنیانەی کە لە نەفسە پیس و کارە گومڕاکانیان شاردبوویانەوە دەریخست ، هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی:

{وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ}

واتە : ( ئا بەو جۆرە ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ ئەوەی ڕێگای تاوانباران ڕوون بێتەوە )

جا لە گەورەترینی هۆکاری گومڕاییەکەیان:

**یەکەم** : ئامادە نەبوون نەفسی خۆیان بشکێننەوە ، لەو کیبر و خۆ بەگەورە زانینەی کە الله تعالى پەیمانی بە خاوەنەکەی داوە ( واتە ئەو کەسەی کە خۆ بەزل زانی هەیە ) لایبدات و دووری بخاتەوە لەوەی کە ئایەتەکانی الله تعالى سوودی پێ بگەیەنێت و هیدایەتی بدات ، هەروەک الله تعالى فەرموویەتی:

{ سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ الرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ الْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ }

واتە : ( ئەو کەسانەی کە بە ناحەق فیز دەکەن لە زەویداو خۆیان بە گەورەتر دەنوێنن ( لە خەڵکی )، لەمەودوا ڕووی دڵیان وەردەچەرخێنم لە تێگەیشتنی ئایەت و فەرمانەکانم ، خۆ ئەوانە ئەگەر هەر بەڵگە و نیشانەیەک ببینن ئەوە باوەڕی پێناکەن ، ئەگەر ڕێبازی بەرژەوەندی دنیاو قیامەت ببینن ئەوە نایگرنە بەر ، خۆ ئەگەر ڕێبازی ئارەزوو پەرستی و گومڕایی ببینن ، ئەوە دەیگرنە بەرو پەیڕەوی دەکەن ، ئەوە

لەبەر ئەوەیە چونكە بەڕاستی ئەوان بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەكانی ئێمە نەبوو لێیان بێئاگا بوون.)

[ سورەتی الأعراف : ١٤٦ . تەفسیری ئاسان ]

وە هەر لە ئایەتی پێشە خۆیدا ، الله تعالى دەفەرموێت دەربارەی ئەو لەوح انەی كە بۆ موسای ناردبوو ( علیه السلام ) ، هەروەكو چۆن الله تعالى دەفەرموێت:

{ وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا بِأَحْسَنِهَا ۚ سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ }

واتە : ( لە تابلۆكانی ( تەوراتیشدا ) لە هەموو بابەتێكمان بۆ تۆمار كردبوو ، ئامۆژگاری تێرو تەواو ( بۆ هەموو چالاكیەكانی ژیان )، هەروەها ڕوون كردنەوە بۆ هەموو شتێك و هەموو بابەتێك ، كەوابوو ئەی موسا : بە توندی بیانگرە و پەیڕەویان بكە و فەرمان بە قەومەكەشت بدە : كە بە جوانترین شێوە وەریان بگرن و پەیڕەویان بكەن ، لە ئایندەدا خانووبەرە و شوێنی تاوانبارو لە سنوور دەرچوانتان نیشان دەدەم ( چۆن وێرانی دەكەین )).

الله تعالى هەواڵی داوە كە لە هەموو ئەو شتانەی تێدایە كە بەندەكان پێویستیان پێی دەبێت لە ئامۆژگاری تێرو تەواو كە نەفسەكان ئارەزووی دەكەن بۆ ئەنجام دانی خێر و چاكە ، وە لە ترساندنیشیان

لە ئەنجام دانی خراپە وە شیکەرەوەیە بۆ هەموو شتێک لە حوکمە شەرعیەکان و بیرو باوەڕو ئەخلاق و ڕەوشت و ئادابەکان ، پاشان الله تعالی هەواڵی داوە کەوا موتەکەبیر و خۆ بەگەورە زانەکان بێ بەش دەکات لەوەی کە هیدایەت وەربگرن پێی بەڵکو وایان لێ دەکات کە هەر لەنێو گومڕایدا بن ، جا ئیمان و باوەڕیش بە ئایەتەکانی الله ڕەت دەکەنەوە و ڕێگای گومڕایی دەگرنە بەر ، وە هەروەها لە ڕێگای ڕێنموونی و هیدایەتیش دوور دەکەونەوە ، وە هەموو ئەمانەش سزا و عقوبەیە بۆیان لەسەر باوەڕ نەهێنانیان بە ئایەتەکانی الله و خۆ بێ ئاگا کردن و خۆ نەفام کردنیان لێی و بە کەم دانانی ئایەتەکانی الله تعالی.

بەنی ئیسڕائیل تەنها پێغەمبەری ئێمەیان محمد ( صلی الله علیه وسلم ) تەکذیب نەکردووە و بەناڕاست دانەناوە ، بەڵکو بەردەوام ئەمە پیشەیان بووە لەگەڵ هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە الله تعالی بۆیانی ناردووە لەدوای موسا ( علیه السلام ) کە لەگەڵ هەواو ئارەزوویان نەگونجابێت بە ناڕاستیان داناوە ، بەڵکو تاوانباری تیایاندا گەیشتبووە ئەوەی کە لەناویاندا کۆببویەوە بەناڕاست دانانی هەندێک لە پێغەمبەران و کوشتنی هەندێکی تریان ، الله تعالی فەرموویەتی:

{ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَقَفَّيْنَا مِن بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَىٰ أَنفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ }

واتە : ( سوێند بێت بێگومان ئێمە تەوراتمان بەخشی بە موسا و بەردەوام دوای ئەویش پێغەمبەرانمان ڕەوانە كردو بە عیسای كوری مەریەم بەڵگە و نیشانە و موعجیزەی جۆراو جۆرمان بەخشی هەروەها پشتگیریمان كرد بە فریشتە ( جبرئیل )، ئایا چۆن دەبێت هەر كاتێك پێغەمبەرێكمان ڕەوانە كردبێت ، بەڵام لەگەڵ ئارەزووەكانی ئێوەدا نەگونجا بێت ، خۆتان بەزل زانیوە و لووتتان بەرز كردۆتەوە و بڕواتان نەهێناوە ، ئەوسا دەستەیەكتان ( بەرنامەی اللہ تان ) بە ناڕاست زانیوە و هەندێكیشتان پێغەمبەرانتان دەكوشت. )

**دووەم** : حەسوودی و ئیرەیی بردنیان بوو بە رسول اللہ ( صلى اللہ عليه وسلم ) چونكە اللہ تعالى ئەوی دیاری كرد و هەڵیبژارد بۆ پەیامەكەی خۆی ، وە ئەو كۆتا پێغەمبەرەی لەنێو بەنی ئیسرائیل دا نەنارد ، اللہ تعالى فەرموویەتی:

{ وَلَمَّا جَاءَهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَمَّا جَاءَهُم مَّا عَرَفُوا كَفَرُوا بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْكَافِرِينَ * بِئْسَمَا اشْتَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا بِمَا أَنزَلَ

اللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ فَبَاءُوا بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ }

واتە : ( كاتێك لە لایەن الله وە كتێبێك ( قورئان ) هات بۆیان ، كە : ئەو كتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەكات و بەڕاستی دەزانێت ، ئەوان پێشتر داوای سەركەوتن و زاڵ بونیان بەسەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە الله دەكرد بە هۆی شوێنكەوتنیان بۆ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )، كەچی كاتێك ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات كە دەیانناسی ، بڕوایان پێ نەكرد ، كەواتە با نەفرین و لەعنەتی الله لەسەر كافران بێت * ( ئەو جوولەكانە ) خۆیان بە شتێكی ناپەسەند فرۆشت ( هەڵوێستێكی نادروستیان نواند ) كاتێك كافر بوون بەو قورئانەی الله ناردوویەتی ، ( لە حەسوودی ) و سەركەشیدا ( ڕەخنەیان گرت و وتیان ) : بۆچی الله دەرگای فەزڵ و لای ڕەحمەت دەكاتەوە لە هەركەسێك بیەوێت لە بەندەكانی !! ئەوسا ئیتر دووچاری یەك لە دوای یەكی ڕق و خەشمی الله بوون ( چونكە وەنەبێت تەنها كافر بوو بن بە محمد ( صلى الله عليه وسلم ) و بە قورئان ، بەڵكو كافربوون بە موسا و تەوراتیش كە داوای شوێنكەوتنی محمدیان لێدەكات ) و بۆ كافر و الله نەناسان سزایەكی ڕیسواكەر ئامادەیە )

واتە : کاتێک کتێبێکیان لەلایەن اللە ـەوە بۆ هات لەسەر دەستی چاکترین درووستکراو و کۆتایەمینی پێغەمبەران کە بەڕاست دانانی ئەو کتێبەشی لەخۆگرتووە کە لەلایانە کە تەوراتە ، لەکاتێکدا عیلم و زانست و یەقینیشیان بەمە هەبوو ، هەتاوەکو کار گەیشتبووە ئەوەی کەوا کاتێک جەنگ ڕوویدەدا لەنێوان خۆیان و لەنێوان موشریکەکاندا لە سەردەمی جاهیلیەتدا داوای سەرکەوتنیان لە اللە دەکرد بەهۆی ناردنی ئەم پێغەمبەرەوە ، وە هەڕەشەیان لە موشریکەکان دەکرد بەوەی کەوا جەنگ لەگەڵ موشریکەکان دەکەن لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەی کە بۆیان دێت ، جا کاتێک ئەم قورئان و پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەیانناسی بڕوایان پێ نەکرد بەهۆی ئەو سەرکەشی و حەسوودیەی کە هەیانبوو لەوەی کە اللە تعالى دەرگای فەزڵ و لای ڕەحمەت دەکاتەوە لە هەرکەسێک بیەوێت لە بەندەکانی ، جا اللە تعالى ش لەعنەتی لێیان کرد وە خەشم و توڕەیی خۆی دەباراند بەسەریان بە خەشم و ڕقی یەک لەدوای یەکی خۆی لەبەر زۆری کوفر و بێ باوەڕیان و گومان و شیرکی یەک لەدوای یەکیان ،

(وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ)

واتە : ( و بۆ کافر و بێ باوەڕان سزایەکی ڕیسواکەر ئامادەیە )

واتە : سزایەکی ڕیسواکەری بە ئێشی پڕ زەحمەت بۆیان ئامادەیە کە لەنێو دۆزەخدا دەسوتێنرێن ، وە لەدەست دانی خۆشیەکی نەبڕاوە و جێگیر.

وە هەروەها حەسودی لە گرنگترینی هۆکارەکان بوو کە زانایانی ئەهلی کتابی لە ئیسلام دوور خستەوە و لەبەرامبەریشدا موحارەبە و دوژمنایەتی ئیسلامیان دەکرد ، وە هەوڵیان دەدا ئەو کەسانەی کە موسلمان بووینە هەڵیانبگەڕێننەوە بۆناو کوفر ، الله تعالی دەفەرموێت:

{وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ}

واتە : ( زۆرێك لە خاوەن کتێبەکان ئاواتە خوازن لەبەر حەسوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکرێت بتانگێڕنەوە ڕیزی بێ باوەڕان ، ئەمەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستییان بە تەواوی بۆ ڕوون بۆتەوە )

**سێیەم** : لە هۆکاری گومڕایەتی زانایانی ئەهلی کتاب:

نەبوونی خەوف و ترسانیان بوو لە الله تعالی ، وە بەڵگەش لەسەر ئەمە ووتەی الله تعالی یە کە دەفەرموێت:

{ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ }

واتە : ( ئەی نەوەی ئیسرائیل ( نەوەی یەعقوب ( سەلامی الله ی لەسەر بێت )) یادی نازو نیعمەتی من بکەنەوە کە بەسەرتاندا ڕژاندومە و بەوەفاو بەئەمەك بن و پەیمانەکەم جێبەجێ بکەن ( کە ئیمان و کردەوەی چاك و باوەڕکردنە بە هەموو پێغەمبەران بەبێ جیاوازی ) ئەوسا منیش پەیمانی خۆم بەجێ دەهێنم ( کە جێنشین کردنتانە لە دونیاداو ، بەهەشتی بەرینە لە قیامەتدا ) باترس و بیمتان تەنها لە من هەبێت )

**چوارەم** : لەبەر دڵ ڕەقیان بوو ، هەروەکو چۆن الله تعالى هەواڵی لەبارەیانەوە پێداوە کە فەرموویەتی:

{ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ }

واتە : ( ئایا ئیتر ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، دڵەکانیان بە نوری ئیمان ملکەچ و ڕوناک بۆتەوە ، ترسی الله ی تێدا بڕوێنن بەهۆی یادی بەردەوامی الله و ئەو قورئانەی کە ڕەوانەکراوە ، وەک ئەو کەسانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ ڕەوانە کرا ، بەڵام

دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەکی دوورو درێژ ، دڵیان ڕەق و ڕەش بوو ، زۆربەشیان یاخی و سەرکەش و نالەبار دەرچوون.)

وە ئەم ووتەیەی الله تعالى : ( فَطَالَ عَلَيْهِمُ الأَمَدُ )

واتە : وەکو ئەوکەسانە مەبن کە الله تعالى کتابی بەسەردا دابەزاندن کە هۆکارێک بوو بۆ خشوعی و ملکەچ بوونی دڵ و گوێڕایەڵیەکی تەواو ، لەپاشاندا بەردەوام و جێگیر نەبوون لەسەری بەڵکو ڕۆژگارێکی زۆر بەسەریان تێپەڕی بەڵام هەر بەردەوام بوون لە غەفڵەت و بێ ئاگایی ، بەهۆیەوەش ئیمانیان لەدەستدا و یەقین و گومانیشیان نەما بۆیەش دڵەکانیان ڕەق بوو ، ( وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ )

جا لە هەموو کاتێکدا دڵەکان پێویستیان بەوەیە کە لە یادی ئەو کتابەی الله تعالى دابن کە دایبەزاندووە ، وە نابێت بێ ئاگابن لەمەدا ، چونکە بێ ئاگایی هۆکارێکە بۆ ڕەق بوونی دڵ و ووشک بوونی چاوەکان.

**پێنجەم** : هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیان ، ئەو پەیمانەی کە الله تعالى لێیانی وەرگرتبوو ، الله تعالى دەفەرموێت:

{ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةًۖ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا بِهِ }

واتە : ( ئینجا بەهۆی ( پاش گەزبوونەوە و ) هەڵوەشاندنەوەیان بۆ پەیمانەکەیان نەفرەتمان لێ کردن وە دڵەکانیانمان گێڕا بە دڵێکی ڕەق و وشك ، وتە و فەرموودەی الله لادەدەن لە شوێنەکانی خۆی ، وە لە بیریان کرد بەشێکی زۆرلەوەی کە ئامۆژگاری کرابوون پێی )

**داوا لە الله تعالی دەکەین کە یارمەتیمان بدات و بەردەوامان بکات لەسەر شوێنکەوتنی حەق و بمانپارێزێت لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووومان ، آمین. ...**

# ( بەشی سێیەم )

لە زنجیرەی ڕابردوودا قسەمان کرد لەبارەی ئەو سیفات و کارانەی کە اللە تعالی بەهۆیەوە ڕق و غەزەبی خۆی ڕژاند بەسەر زانایانی ئەهلی کتاب ، وە هۆکاری ئەمەش هەر بە کورتی بریتی بوو لە : کیبر و خۆ بەگەورە زانین ، وە حەسوودی ، وە نەبوونی خەوف و ترسانیان لە اللە تعالی ، وە دڵ ڕەقیان ، وە فرۆشتنی ئایەتەکانی اللە تعالی بە نرخێکی کەم ، وە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیان لەگەڵ اللە سبحانە وتعالی ، وە بە ناڕاست دانانی پێغەمبەران و نێردراوەکانی اللە تعالی ، وە کوشتنی هەندێکیان ، وە ئیمان و باوەڕ نەهێنانیان بە کۆتا نێردراو و دوایەمینی پێغەمبەران محمد ( صلی اللە علیە وسلم ) وە هەروەها شاردنەوەی سیفەت و خەسڵەتی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) ، وە شێواندن و تێکەڵ کردنی حەق بە باطل.

وە هەروەها وازیان نەهێنا تەنها بە ئیمان نەهێنان پێی بەڵکو چوونە ڕیزی دوژمنەکانی و لەگەڵیان وەستان لەدژی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) وە هەوڵیان دەدا کەوا هەرکەسێک ئیمانی پێ هێناوە دووری بخەنەوە لە ڕێگای اللە تعالی ، وە هەروەها شاهێدیان بۆ دوژمنەکانی دەدا لە کافرانی قورەیش بەوەی کە ئەوان ڕێگاکەیان

ڕاستترە لە ڕێگای پێغەمبەرمان محمد ( صلى الله عليه وسلم ) و هاوەڵە هەڵبژێردراوەكانی ، هەروەكو چۆن الله تعالى دەفەرموێت:

{ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلًا * أولئك الذينَ لعنَهُمُ اللهُ ومن يلعنِ اللهُ فلن تجدَ له نصيرًا * أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لاَّ يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا * أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ فَقَدْ آتَيْنَآ آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا * فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ وَكَفَى بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا }

واتە : ( ئایا ئاوڕێكت نەداوەتەوە لەوانەی بەشێك لە نامەی الله یان پێدراوە بڕوا ئەهێنن بە شتی بێ نرخ و بەرنامەی غەیری الله ( بە جادووگەران و بە شەیتان ) وە ئەڵێن بەوانەی كە بێ بڕوان ئەوانە ڕێبازیان ڕاسترە لەوانەی كە باوەڕیان هێناوە * ئا ئەوانە كەسانێكن كە الله نەفرینی لێ كردوون ، هەر كەسێكیش الله نەفرینی لێ بكات ئەوە هەرگیز دەست ناكەوێت بۆی هیچ یارمەتی دەرێ * ئایا ئەوانە ( جوولەكەكان ) بەشیان هەیە لە دەسەڵاتی پاشایەتی ( خاوەنێتی بوونەوەر ) ؟ ( جا ئەگەر بیانبوایە ) ئەو كاتە بە خەڵكیان نەدەبەخشی ( بە ئەندازەی ) توێكڵی دەنكە خورمایەك * یان ئێرەیی ( حەسوودی

) دەبەن بە خەڵکی ؟ لەسەر ئەوەی الله پێی بەخشیوون ( کە پێغەمبەرێتیە ) لە فەزڵ و بەهرەی خۆی ئەوە بێگومان داومانە بە نەوەی ئیبراهیم کتێب و پێغەمبەرێتی هەروەها پێمان بەخشین دەسەڵاتێکی گەورە * جا لەو خەڵکەدا هەبوو بڕوایان بە ( موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم )) هێنا هەشیان بوو بەرگری لێ کردووە ، وە دۆزەخ بەسە ( بۆیان ) کە ئاگرێکی هەڵگیرساوە. (
[ سورەتی النساء :٥١-٥٥ . تەفسیری پوختە ]

وە ئەمە لە کارە هەرە ناشیرینەکانی جولەکەکان و حەسوودی بردنیان بە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) و ئیمانداران بوو ، بەوەی کە ئەخلاق و ڕەوشتە ناشیرینەکەیان و سرووشتە پیسەکەیان بەکار دەهێنا لەسەر ئیمان نەهێنان بە الله و پێغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە لەجیاتی ئەمە ئیمانیان دەهێنا بە بت و جادووگەر و طاغوت ، کە ئەویش بریتییە لە ئیمان و باوەڕ هێنان بە هەموو پەرستراوێکی غەیری الله تعالى یان حوکم کردن بە غەیری شەرعی الله سبحانه وتعالى.

جا لەمەدا ساحیر و کاهین و بەندایەتی کردنی غەیری الله و گوێڕایەڵی کردنی شەیتان و هەموو ئەمانە دەگرێتەوە لە مانای ( الجبت والطاغوت. )

